# کاروان

**تایبەتی‌یە بۆ**
**هەفتەی قادسیەی صدام**
**و**
**چەژنەکانی ئازارو نەورۆز**

گۆڤاریکی رۆشنبیری مانگانەیە
ئەمیندارێتی گشتی ی رۆشنبیری ولاوان
بەزمانی کوردی وعەرەبی دەری دەکا

پاشکۆی ژمارە **18** ئازاری / 1984



## لەم پاشکۆیەدا

### بەشی کوردی


| | | |
|---|---|---|
| وتەی ژمارە | دەستەی نووسەران | 2 |
| نەورۆز | پیرەمێرد | 6 |
| نەورۆزی نوێ و پیرەمێرد | کەمال رەئووف محەممەد | 7 |
| نەورۆزو بەهار لە فۆلکلۆری کوردیدا | دوکتۆرە شوکریە رەسول | 15 |
| گۆران و بەکارهێنانێکی نوێی رەمزکانی نەورۆز | کەریم شارەزا | 20 |
| نەورۆز هەمیشە تازەو کاری گەرە | حسین رەشوانی | 27 |
| شیعرو نەورۆز | محسن ئاوارە ، جلال مدحت خۆشناو ، محمد امین پێنجوێنی ، رۆستەم باجەلان ، مدحت بێخەو ، پیربال محمود ، ئەقدەسی مەریوانی عبدالله بابا علي ، بهجت محمد هروری ، فیصل مصطفی حاجی ، گوشاد حمە سعید ، پەخشان شوانی .. | 30 |
| سەردانی سەرنووسەری «کاروان» لە دەزگای رۆژنامەگەری «بۆربا» لە یوگسلافیا . | کاروان | 43 |
| سرایێڤۆ .. شاری کەلەپوورو ئۆلۆمپیاد .. | نووسینی : جمیل روفائیل و . کاروان .. | 45 |


### القسم العربي


| | | |
|---|---|---|
| كلمة العدد | هيئة التحرير | 49 |
| حصاد الاربعين شهراً هنا وهناك | ح . ر | 52 |
| ذكريات عن نوروز | علي النقشبندي | 59 |
| جهود متميزة .. وانجازات ثقافية وشبابية مثمرة . | هوزان الحريري | 60 |
| تنويه | هيئة التحرير | 64 |


ئەدرەس : هەولێر ـ ئەمیندارێتی گشتی ی رۆشنبیری ولاوان ـ گۆڤاری «کاروان» ـ ت 20882

# سەربەرزی بۆگەلمان لەجەژنەکانیدا

بە دەرچوون و بڵاوکردنەوەی ژمارە 17 ی گۆڤاری کاروانی خۆشەویست ، ئێمەو خوێنەرانی بەڕێزو جەماوەری گەلە نەبەزەکەمان ، خۆمان ئامادە دەکەین بۆ پێشوازی کردن لە بەهار ، پێشوازی کردنی مانگی یەکەمی وەرزی بەهار ، مانگی ئاداری قەشەنگ ، پێشوازی کردنی چەند جەژنێکی مەزن و پیرۆز کە جەماوەری عیراقی نەبەز لە سەرانسەری وولاتدا ئاهەنگ و زەماوەندی بۆ ساز دەکەن ، هەموو عیراقی یە خێرخوازەکان ئاهەنگی بۆ دەگێڕن بە تایبەتی رۆڵەکانی گەلی کورد . وە لە کاتی ئاداری خێرو بەرەکەت و بەهارو کورد لە هەموو ساڵێکدا دێت ، دەبێ لە بیرمان نەچێ کە زنجیرەیێك لە جەژن و ئاهەنگ ساز دەکرێن و ئاهەنگیان بە درێژایی رۆژانی ئەو مانگە بۆ دەگێڕرێت .. مانگی ئادارو ئاهەنگ گێران بە بۆنەی ئەو جەژنانە بووەتە نەریتێکی شۆڕشگێرانەو پێشکەوتنخوازانە ، مانگی ئادار لە لای هەموومان بە ئاهەنگ و فیستیڤال و ئۆتۆنۆمی و خۆشی و شادیی کوردان بە پلەیێکی سەرەکی بەستراوە بۆیە جێگای سەر سوڕمان نیەو بەڵکو شتێکی زۆر ئاسایی یە ئەگەر لەم مانگەدا کەیف و زەردەخەنەو شادی لە دەم و چاوی هەمو عیراقییەك بەدی بکرێ . ئەو مانگەی لە سایەی شۆڕشی 17 — 30 ی تەمووزی پیرۆز بووەتە جەژن و زەماوەندی هەمیشەیی و گشت رۆژەکانی خەڵکی عیراقی کردۆتە بە گۆرانی و هەڵپەرکێ و شایی . لە کاتێکدا کە جەژن و ئاهەنگەکانی بەر لە شۆڕش بریتی بوون لە چەند یادو جەژنێك ، کە چی ئەو شۆڕشەی لە 17 ی تەمووزی ساڵی 1968 دا بەرپا بوو تەقییەوەو لە ئەنجامی ئەو دەستکەوتووە گەورانەی بۆ گەلی عیراقی هێنایە دی . لەو کاتەوە جەژنە نیشتمانی و نەتەوایەتیەکانمان زۆرو جوراو جۆرن و هەمیشە هەر لە زۆر بوون دانەو رۆژ لە دووای رۆژدا دانیشتوانی بەشەرەفی عیراق هەست بە دڵنیایی و هێمنی دەکەن . لێرەدا جەژنەکانی ئادارو نەورۆزو هەفتەی قادسیەی صەدامی پیرۆز کە گشتیان لە مانگی ئاداردا ساز دەکرێت . جگە لەمەش جەژنەکانی تەمووز 14 و 17 و 30 ی تەمموز کە لە مانگی تەمووزدا ساز دەکرێن ، لە پاڵ ئەم جەژن و بۆنە گرنگانەش بۆ نموونە ، ئەنگوست ، بۆ چەند جەژن و بۆنەی تریش رادەکێشین ، کە لە رووی گرنگیانەوە دێنە ریز ئەو جەژنانەی باسمان کردن ، وەك جەژنەکانی : هەشتی شوبات و هەفتی نیسان و شەشی کانوون ، یا خۆد ئەو بۆنانەی وەك : خۆماڵی کردنی نەوت و .. هتد .. تا رادەیێك هاوولاتی عیراقی بۆی ناکرێ بە سانایی ئەو جەژن و یادو بیرەوەرییانە بژمێررێت . زۆری جەژن و بۆنەش و جۆراو جۆریان لە لایەن هەر گەلێك لە گەلاندا ، نیشانەی چالاکی ئەو گەلەیەو نیشانەی پێشکەوتن و پەرەسەندنی رادەی رۆشنبیری و شارستانیەتیەتی و بڵاوبوونی خۆشی و بەختیاری و ژیانێکی پڕ لە کامەرانیی ئەو خەڵکەیە . ئەوەی لێرەدا شایانی باسکردن بێت ئەوەیە کە ئاهەنگ گێران بە بۆنەی جەژن لە وولاتەکەماندا شێوەیێکی جەماوەریی گەورەو فراوان دەگرێتە بەر تارادەیێك شەقام و گۆرەپان و شوێنەوارە گەشت و گوزارەکان ناتوانن بیگرنەوە .

ئەوەی سەرنج بداتە جەژن و ئاهەنگەکانی نیشتمانی لە عیراقماندا ئەوەی بۆ دەر دەکەوێ کە ئاهەنگ گێران شێوەیێکی ئاسایی و تەسك و ووشك وەرناگرێ ، بەڵکو توانای گیانیی گەل و پەیدا بوونی سەدان لە بەهرەی هونەریی نوێ بەدی دەکات چ لە پیشانگە تایبەتیەکان بە جۆرەها هونەرو دەیەها ووتارو هۆنراوەو چیرۆك و شانۆگەری کە لە دەزگای رۆشنبیریو

# سەرکەوتن بۆگەلمان لە جەنگی ڕەوایدا

ڕاگەیاندنی جۆراو جۆر پێشکەش دەکرێن و بڵاو دەکرێنەوە . جەژنیش لە وولاتماندا زۆرە ، جەژنی نیشتمانیمان هەیە کە گشت عیراقیەکان ئاهەنگی پێ دەگێڕن . جەژنی ئەوتۆیشمان هەیە کە بەشێك یا خود چینێك ئاهەنگی بۆ دەگێڕی وەك : جەژنی مامۆستاو جەژنی ئافرەت و جەژنی هاتووچوو .. هتد . ئێمە لەم بڕوایە داین کە رۆژو مانگ و وەرزەکانی داهاتوومان گشتیان دەبنە جەژن و خۆشی و هەڵپەڕکێ ، لە سایەی سیاسەتە راستەکەی پارتی سەرکردەو هەڤاڵی تێکۆشەر صدام حسین .. هەزار .. هەزار .. سڵاو بۆ :

جەژنی 11 ی ئاداری مێژوویی .

بەڵێ هەزار هەزار سڵاو بۆ رۆژی 11 ی ئاداری مێژوویی ، جەژنی هێنانە دیی مافە نەتەوایەتی یەکانی گەلی کورد ، ئەو جەژنەی لە رۆژی 11 ی ئاداری ساڵی 1970 دا واتە بەر لە 14 ساڵدا دووای دەرخستن بەیاننامەیێکی مێژووی گرنگ لە لایەن میریی شۆڕشی 17 — 30 ی تەممووزدا لە دایك بوو . ئەو بەیاننامەی کە بریتی بوو لە ئیعتراف کردن بە مافە ڕەواکانی گەلی کورد لە سەرووپانەوە ماف ئۆتۆنۆمی و سووڕاندنی کاروبار بە شێوەیێکی سەربەخۆو لە چوار چێوەی کۆماری عیراقدا . ئا بەم جۆرە بەیاننامەی 11 ی ئاداری ساڵی 1970 کە ئاواتێکی مەزنی کوردی هێنا دی ، لە هەمان کاتدا بە یەکێك لە هەرە رووداوە گرنگەکانی مێژووی عیراق بە گشتی و مێژووی گەلی کورد لە هەر شوێنێك بێت لەم جیهانەدا بە تایبەتی ، دەژمێررێت . چونکە لەم رۆژەدا واتە لە 11 ی ئاداری ساڵی 1970 دا ، بۆ یەکەم جار لە مێژوودا دان بە ئۆتۆنۆمی بۆ گەلی کورد لە کوردستانی عیراق نراو لاپەڕەیێکی نوێ لە مێژووی عیراق کرایەوەو برایەتی عەرەب و کوردو کێشەی خەباتی هاوبەشیان دژی ئیمپریالیزمی جیهانی لە سەر بناغەیێکی پتەو قاییم چەسپاو بارێکی شۆڕشگێڕانەی نوێ و مەزن هاتە ڕوو بارێکی شۆڕشگێڕانە لە ئەنجامدا مەترسی بە ئیمپریالیزم و زایۆنیزم و رژێمە دیکتاتۆریە کۆنە پەرستەکان لە ناوچەدا گەیاندو لە دووای رۆژانی یەکەمی دەرچوونی بەیاننامەی 11 ی ئاداری مێژوویی شۆرش دەستی کرد بە دروست کردنی ئۆتۆنۆمی لە سەر بناغەیێکی پتەو سەرەڕای هەموو ئەو هەوڵ و تەقەللاو پیلانەی ئیمپریالیزم و بنکە کۆنەپەرستە گومان لێکراوەکانی لە ناوچەدا ، گیروگرفت بە هیچ جۆرێك نەیتوانی کارێکی سەلبی بخاتە هەنگاو سیاسەتەکانی سەرەکی فەرماندەو میریی نیشتمان پەروەر ، کە وەفای دڵسوزی خۆیان بەرامبەر جەماوەری گەلی عیراقمان و جەماوەری گەلی کورد نواندو لە رۆژی بڕیار لە سەر دراودا واتە رۆژی 11 ی ئاداری ساڵی 1974 ئۆتۆنۆمی بۆ گەلی کورد لە عیراقدا دەرچوو هەموو هێزە خێرخوازەکانی بە شەرەف جیهان پیرۆزباییان لەو هەنگاوە کردوو خۆش حاڵی خۆیان دەربڕی و دووای بڕیاردان لە سەر جێ بەجێ کردنی ئۆتۆنۆمی دەزگای دەستووری و ڕاپەڕاندن بۆ ئەم مەبەستە دامەزراو هاتە کایەوە ، وەك ئەنجوومەنی یاسادانان و ، ئەنجوومەنی ڕاپەڕاندن کە ئەمینداریتی گشتی یەکانی پێ بەستراوەو لە رۆژی دامەزراندنیانەوەو تا ئەمڕۆ بێ ووچان کار دەکەن و چالاکی جۆراو جۆر لە پێناو چەسپاندنی مافە ڕەواکانی کورد دەنوێنن و ئەوەی شایانی باسە گەلەکەمان نوێنەرانی خۆی بۆ ئەنجوومەنی یاسادانان لە ڕێگای هەڵبژاردن و بە شێوەیێکی نهێنی هەڵدەبژێری ، ئەو مافەش بە شێوەیێکی یاسای و دەستووری بەکاری دەهێنی . ئەمە جگە لە ماف هەڵبژاردنی نوێنەرانی بۆ ئەنجوومەنی

نیشتمانی ، راسته ئەو وتەی دەڵێ : کورد لە عیراقدا دوو مافی هەیە .

## سڵاوی خۆشەویستی بۆ نەورۆز

جەژنی نەورۆزی پیرۆز بە گەورە ترین جەژنی نەتەوایەتی گەلی کورد دەژمێردرێت چونکە ئەو جەژنە لە لای کورد سەرەتای بەهارەو یەکەمین رۆژی ساڵی نوێی کوردیەو یەکەم شۆڕشی کوردە دژ بە ئەژدەهاکی خوێن خۆر . لە سەردەمەکانی ڕژێمی پێشوودا جەماوەری گەلی کوردمان بە شێوەیێکی زۆر نهێنیی و پڕ لە مەترسی ئاهەنگی دەگێڕا بە بۆنەی ئەم جەژنە پیرۆزە ، لە ئەنجامدا رۆڵە نەبەزەکانی ڕوو بەڕووی جۆرەها ئازارو ئەشکەنجەو تۆقاندن دەبوون ، ئەو دەستەلات داریە گۆڕ بە گۆڕانەی پێشوو پەیتا پەیتا بە شێوەیێکی دڕندانە ئاگری نەورۆزیان دەکوژاندەوەو سزای تێکۆشەرانیان دەدا .

میری نیشتمان پەروەر لە عیراقدا هەر بەوە ڕانەوەستا کە دان بە نەورۆز بنێ وەك جەژنێك بۆ کورد بەڵکو بڕیاریدا نەورۆز ببێتە جەژنێکی رەسمی بۆ گشت هاووڵاتیانی عیراق نەك بە تەنها بۆ گەلی کورد .

بەم بۆنەیەوە گەلەکەمان شانازی بە برا هاونیشتمانیەکانی دەکات لە عەرەب و تورکمان و ئاسووری بە بەشدار بوونیان لە ئاهەنگەکانی ئەو جەژنە نەتەوەیی یە گەورەیەدا .

هەر وەها شانازیش بەوە دەکات کە میرییێکی نیشتمان پەروەرو بە هێز دان بە جەژنەکەی دا دەنێ و بە ڕێك و پێکی ڕێگا بۆ جەماوەرەکەی خۆش دەکات بۆ ئاهەنگ گێڕان بە بۆنەی ئەو جەژنە . ئەو جەژنەی کە ئاهەنگ گێڕانی تیا قەدەغە بوو لە سایەی ڕەشی ڕژێمە گۆڕ بە گۆڕەکانی پێشوودا .

بەڵێ بۆ یەکەم جار لە عیراقدا دان بە مافە نەتەوایەتیەکانی کورد نرا لە سەرووی ئەم مافانەش مافی ئۆتۆنۆمی یە لە چوار چیوەی کۆماری عیراقدا ، ئەو مافە کە تا ئێستا لەو وولاتانەی کە کوردی لێ دەژین قەدەغە کراوە ، لە عیراق نەبێت لە سایەی میری شۆڕشگێڕدا بۆ یەکەم جار دان بە جەژنی نەورۆز نرا . وەك جەژنێك بۆ کوردو براکانی لە نیشتمانی عیراقدا .

لە نەورۆزی ئەم ساڵ ساڵی 1984 دا هەر وەکو باسمان کرد 14 ساڵ بەسەر دەرچوونی بەیاننامەی 11 ی ئاداری مێژوویی و هەر وەها دە سالیش بە سەر دەرچوونی یاسای ئۆتۆنۆمی و جێبەجێ کردنی لە کوردستانی عیراقدا تێ دەپەری .

جەماوەری کورد لە گەرمەی ئاهەنگ گێڕانی نەورۆزی ئەم ساڵ و لە دووای چەند تاقی کردنەوەیێکی بە نرخ باش دەزانێ و چاکی بۆ ڕوون بۆتەوە کە میری شۆڕشی 17 — 30 تەمموزی پیرۆز بە سەرکردایەتی سەرۆکی تێکوشەر « صدام حسین » تاکە دلسۆزە بۆ هەموو بەرژەوەندی و مافە نەتەوایەتیەکانی و بەردەوامە لە تێکۆشان و هەوڵدان بۆ هێنانە دی دواڕۆژێکی خۆشتر بۆ کورد ، ئەمە نیشانەی دلسۆزییتی بۆ گەلی کورد وڕێزگرتنە لە هەستی نەتەوایەتی و خواستی سەربەستی و لایەنگرتنی کێشەکەی .

لە دان پیانانی تەواو بە مافە نەتەوەییە ڕەواکان و لە ئۆتۆنۆمی بۆ گەلی کورد دەردەکەوێ کە هەموو وتەو درۆیەکانی کاربەدەستانی تاران و گشت کاربەدەستە دیکتاتۆریەکانی ناوچە ، پوچەل و بایەخ پێ نەدراوون و هەموو هەڵبەستان و پڕوپاگەندەکانیان بە بازرگانی کردن بە کێشەی کورد لە قەڵەم دەدرێن و لە لایەن رۆڵەکانی گەلەکەمان ڕسوا کراوون .

هەر وەها پێویستە لەسەر ڕژێمەکانی ئەو وولاتانی کە کوردی تیا دەژین وەك گەل و نەتەوە ئەو ڕاستیە چاك بزانن کە پێوەری پلەی دلسۆزی بۆ گەلی کورد تەنها بریتی یە لە دان پێنان بە مافە نەتەوایەتیە ڕەواکانی ، بە تایبەتی مافی ئۆتۆنۆمی و ڕێگادان بۆ بەڕێوەبردنی کارو باری خۆی بە شێوەیێکی سەربەخۆ لە چوار چیوەی ئەو کۆمارانەی تیایاندان .

بەڵێ دان پێنانی ئەو کاربەدەستانە بە مافی ڕەوای کوردو پێش برکێیان بە پەرەپێدان و پێشخستنی تەنها ڕێگایە بۆ ئەوەی کورد ببێتە دۆستیان و سوود لە لایەنگیری وەر بگرن . هەروەها .... ئەنجوومەنی بەرگری ئێرانیش کارێکی چاکی کرد هەرکە ئەوەی ئاشکرا کرد کە ئۆتۆنۆمی بۆ گەلی کورد لە ئێراندا مسۆگەر دەکات لەکاتێکدا گەر ڕژێمە کۆنەپەرستیەکەی خومەینی ڕوخاندو فەرمانڕەوایی حوکمی ئێرانی گرتە دەست .

ئەو ڕاستیەی کە رۆڵەکانی نەتەوەی کورد دەیزانن دەربارەی هەڵوێستەکانی ئەو کاربەدەستانەی بارزگانی

بەکێشەی کورد دەکەن تەنها ئازاردانیان بۆ کوردە .

.. سەرکەوتن بۆ قادسیەی « صدام » ی پیرۆزە .

قادسیەی « صدام » ی پیرۆز ، قادسیەی دووەمی عەرەب و عیراقی یەکان ، بەرپابوو وەك جەنگێکی بەرگری دژی دەست درێژیەکەی ئێران بۆ سەر وولاتمان لە رۆژی 4 ی ئەیلولی سالی 1980 دا ، قادسیەی دووەم رووداوێکی مێژوویی گرنگ و گەورەیە ، لە ئەنجامی چەند پێویستێکی بەرگری هاتە دی . قادسیەی « صدام » بە تێکڕای وبە هەموو جەنگەکانی لە سەر درێژای سنوور ، بە قەلاییکی پۆلایی دادەنرێت بۆ پاراستنی ئەو دەستکەوتووە گەورانەی کە بۆ گەلی عیراقمان لە دووای سالی 1968 دا هاتە دی و ئەو هەنگاوەی کە سەرکردایەتی شۆڕش دووای شۆڕشی 17 — 30 تەمموزی پیرۆز هاویشتی چ لە بواری پتەو کردنی بەرەی ناوەوەو چ لە جێبەجێ کردنی ئۆتۆنۆمی بۆ کوردو پیشەسازی کردنی وولات و چارەسەرکردنی کشتوکال بە شێوەییکی شۆڕشگێرانەو خۆمالی کردنی نەوت و بەرز کردنەوەی رادەی معاشی هاوولاتیان و ، جگە لەو هەموو کارو کردەوانەی بە نرخ کە ژماردنیان سانا نی یە لەم لاپەرانەدا ، ئەم هەنگاوانەش زیانی بە بەرژەوەندیەکانی ئیمپریالیزم و کۆنەپەرستانی ناوچەو جیهان گەیاند ، لە ئەنجامدا هێزە ئیمپریالیزمەکان دەستیان کرد بە جموجولی دژی شۆڕش و میری نیشتمان پەروەرو بە درێژایی 16 سال لە تەمەنی شۆڕشی 17 — 30 ی تەمموزی نەمردا ، ئیمپریالیزمەکان پیلان و نەخشە دەکێشن دژی میری ی نیشتمان پەروەرمان و کاروانی گەلی عیراقمان ، وەك پیلان دانان دژی شۆڕش و نەخشەکێشان بۆ کوشتنی و لە ناوبردنی سەرەك کۆمار .. هتد لەو کردەوە تاوانبارانەو نارەوایەو لەو کاتەی کە بە تەواوی نەیانتوانی کار لە سەربەخۆییمان و سیاسەتی میری ی نیشتمان پەروەر بکەن ، دەستیان کرد بە هاندانی کاربەدەستانی ئێران بە تایبەتی تاقمی خومەینی کۆنەپەرست و بەکرێگیراو بۆ پەلاماردانی وولاتمان و لێدانی ئەو دەستکەوتوانەی بۆ میللەت هاتە دی و لە سەرروویانەوە ئۆتۆنۆمی بۆ گەلی کورد ، ئەو ئۆتۆنۆمی یەی وەك درکێکە لە چاوی ئەو کۆنەپەرستانەی حوکمرانی کورد دەکەن لە ناوچەدا بە تایبەتی کۆنەپەرستانی ئێران ئەوانەی خۆیان لە بارێکی ئالۆز دەبینن بەرامبەر پەیدا بوونی رژێمی ئۆتۆنۆمی لە کوردستانی عیراقدا ، هێزە ئیمپریالیزمیەکان نەك هەر رژێمی ئێرانیان پال پێوەنا دژی گەل و وولاتەکەمان بەلکو هانی زایۆنیزمەکانیشیاندا بۆ هاوکاری کردن لە گەل ئێران دژی عیراق ، ئەوە بوو لە موفاعیل نەوەوی ی عیراقیاندا بەر لە چەند سالێکدا . ئەوەی گومانی تیانی یە رێکخستنی جەنگێکی بەرگری و ئازایانە دژی دەست درێژیەکەی ئێران ، تەنها چەك و رێگا بوو بۆ راگرتنی هێرشی دوژمن و شکاندنی . لێرەدا « قادسیەی صدام » ی پیرۆز ، قادسیەی بەرگری کردن لە دەستکەوتەکانی گەلەکەمان و لە ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان ، شتێکی پێویست بوو .

کورد رۆلێکی گرنگ و کاریگەری هەیە لە « قادسیەی صدام » ی پیرۆزدا بە تایبەتی لە دووای ئەوەی کە بۆی روون بۆوە کە ئەو قادسیە پیرۆزە سزادانە بۆ دوژمنانی کورد : کاربەدەستە نەفامەکانی ئێران کە دەیانەوێ لە پەنای پەردەی ئایین خۆیان بشارنەوەو بەربەرەکانی هەموو جموجولێکی نەتەوەیی و دیموکراتی و پێشکەتنخواز بکەن نەك هەر ئەمە بەلکو دوژمنایەتی هەموو مرۆڤایەتی دەکەن .

گەلی کوردمان شانازی بە قادسیەی صدام دەکات و خۆشحالێ خۆی بەرامبەر ئاهەنگەکانی ئەم جەژنە لە مانگی ئادار دەنوێنێ ، مانگی ئۆتۆنۆمی و نەورۆز بەهاری کورد . جگە لەمەش گەلەکەمان هەمیشە ئامادەیە بۆ بەرگری کردن و پاراستنی نیشتمان و شەهید بوون لە ژێر ئالای قادسیەی دووەمدا . پالەوانیەتی کوردیش لەم جەنگەدا ئاشکراو روونە تا رادەییك سەرەکی فەرماندە پەنجەی بۆ ئەم پالەوانیەتەو ئازایەتیەی درێژ کردووە کە لە لایەن جەنگاوەرانی کورد بەدی دەکرێت ، هەروەها خەلاتی دەیەها کوردی ئازای کرد ئەوانەی دلێرانە بەرگریان لە نیشتمانی عیراق کردو خۆیان بەرامبەر هێرشە دڕندانەکانی دوژمنی ئێرانی راگرت .

پیرۆزبێت ئاهەنگەکانی کورد لە ئادارو نەورۆزو قادسیەی دووەمدا .. بژی هەتا هەتا برایەتی کوردو عەرەب ..

تەمەنی درێژ بۆ سەرەك و سەرکەوتنی تەواو بۆ سوپای دلێرمان لە سەرانسەری سنووری رۆژ هەلاتماندا .

« دەستەی نووسەران »



ئەم ڕۆژی ساڵی تازەیە نەورۆزە هاتەوە
جەژنێکی کۆنی کوردە بە خۆشی و بەهاتەوە

چەند ساڵ گوڵی هیوای ئێمە پێ پەست بوو تاکو پار
هەر خوێنی لاوەکان بوو گوڵی ئاڵی نەوبەهار

ئەو ڕەنگە سوورە بوو کە لە ئاسۆی بڵندی کورد
مژدەی بەیانی بۆ گەلی دوور و نزیک ئەبرد

نەورۆز بوو ئاگرێکی وەهای خستە جەرگەوە
لاوان بە عەشق ئەچوون بە بەرە و پیری مەرگەوە

ئەوا ڕۆژ هەڵات لە بەندەنی بەرزی وڵاتەوە
خوێنی شەهیدە ڕەنگی شەفەق شەوق ئەداتەوە

تا ئێستا ڕووی نەداوە لە تاریخی میللەتا
قەڵغانی گوللە سینگی کچان بێ لە هەڵمەتا

پێی ناوێ بۆ شەهیدی وەتەن شیوەن و گرین
نامرن ئەوانە وا لە دڵی میللەتا ئەژین






— 1 —

ئەگەر دەم‌و دووی هەندێك مندالە ووردکێی نەفامی سلێمانی‌ی ڕۆژگاری پیرەمێردی شاعیر " ـ کە هێشتا لە بیرنەچووەتەوە ـ یاد بکەینەوە کە دەیگوت : « ئاگری نەورۆز کرایەوە ... حاجی تۆفیق بوورایەوە » ئەوها ڕاستی‌یە مێژوویی‌یەکەمان دێتەوە بەرچاو کە ئەوەیە : لە یەکەم چارەکی ئەم سەدەیەوە ، پیرەمێرد ، بووژێنەرەوەی ئەم جەژنەو خۆش‌کەری ئەو ئاگرەیە کە بۆ بەرەو دووا ناکوژێتەوە .

... بەلام بووژاندنەوەی‌و هەلگیرساندنەوەی ئەو ئاگرە گەش‌و ڕووناکە کە لەم ڕۆژگارەدا ـ هەموو ـ کوردستانی گرتووەتەوە ، گەلێك چیرۆکی هەیە .. چیرۆکی هەرە کۆنی سەرهەلدان‌و داگیرساندنیشی نا .. هەروەها چیرۆکی جۆری ئاهەنگ گێڕانیشی نا بەتەنها .. بەلکو چیرۆکی ڕووداوی ڕاستەقینە کە ـ چۆن ویستراوە ـ ئەو جەژنە کوێر ببێتەوەو ئاگرەکەیشی بکووژێتەوەو پیرەمێردیش ، هەناسەساردو ناهومێد ببێت !.



محەممەد رەسوول هاوار ـ ی نووسەری « پیرەمێردی نەمر[2] » دەگێڕێتەوەو دەڵێت : « پیرەمێرد بەهۆی گێڕانی ئاهەنگی نەورۆزەوە تووشی گەلێك كێشەو بەرەو كۆنەپەرستی ناوخۆ بووە .. لە هەندێ شوێندا بەتایبەتی لە هەندێ دیوەخاناندا لێی ئەكەوتنە تەقەو توانج تێگرتن . هەندێك ئەیان‌ووت : پیرەمێرد ئاگر پەرستە بۆیە دووای ئاگری نەورۆز ئەكەوێت ، هەندێكی تر ئەیان‌ووت : ئەم بەزمە بەپارەی ئینگلیز پێك‌دێ ، تاقمێكی تر ئەیان‌ووت : نەخێر ئەم بەزم‌و ڕەزمە بەپارەی قونسولی ئێران لە سلێمانی پێك‌دێ .. جگە لەمانەش پیرەمێرد گەلێك جار لەلایەن فرمان‌بەرانی میری‌یەوە تووشی گێرەو كێشە هاتووەو ماوەی گێڕانی ئاهەنگی نەورۆزی لێ گیراوە .. » .

مامۆستا عەلائەددین سجادیش[3] لە ڕایەڵەی باسی ژیانی ڕۆژنامەنووسی‌ی ساڵی 1938 ی پیرەمێرددا ، ئەویش شایەتی‌ی لەسەر ئەو ڕووداوانە دەدات‌و دەڵێت : « بەهۆی ئەوەوە كە جار جار بەلاتینی ئەینووسی ، خێرخوا لێنەگەڕان ، وتیان : بەنووسینی لاتینی‌و بەكردنەوەی ئاگری نەورۆز ئەیەوێ كورد بكا بەگاوورو مەجووس .. ڕۆژنامەكەیان پێداخست ! » . بەلام .. ئایا یەك گرتنی ئەو خێرخواهـ و كاربەدەستانەی ئەو كاتە «!» كە ـ ڕێكەوت‌نی‌یە ـ بەڕاست لەسەر ئەو باسانەیە ؟ هەروەها ئایا ڕقەكە لە پیرەمێرد لەسەر لاتینی‌یە یان لەسەر ئاگری خودایی‌یە یان لەسەر وەبەرنەكەوتنی نانێك‌و شەش پاپراخە ؟؟ ڕاستیی كە ـ لەمەو دووا پتر ئاشكرا دەبێت ـ دەیسەلمێنێت كە دوژمنایەتی‌یەكە ، هەرگیز ، لەسەر ئەوانە نەبووە .. بەلكو لەسەر بیرێكی نوێ‌و ڕۆژێكی نوێ بووە كە جەژنی نەورۆزو ئاگرە خۆشە بەرزەكەی هەر لەگەل یەكەم بەیادكردنەوەدا .. دوو دەستەی لە یەك جودا كردەوە كە یەكەمیان دوژمنی بوو ، دووەمیش دۆستی بوو .

یەكەمیان بیری خۆی هەبوو ، بڕوایشی بەو نەبوو ، چونكە خێری لێ‌نەدەدی كە هەر بۆیەكە بە هی خۆیشی نەدەزانی .. دووەمیان هەلگری بیری پێشكەوتن‌و خاوەنی بڕوا بوو ، چونكە چاكەی خۆی تێدا بوو ، بۆیەكە بە هی خۆیشی دەزانی .. یەكەمیان هەر ئەوانە بوون كە میراتی دەسەلاتداریی‌و زۆرداریی‌و پارەداری‌یان پێ‌بڕا بوو ، ئەویش بەوە كە كوردو نیشتمانەكەی ، دەست‌و پێوەندو مەزرای چلێسی : خان‌و[4] ئەفەندمزو[5] ساحێب‌و[6] گۆچانە پیسەكانیان بێت‌و ئینسانی كورد .. هەر بڕووتێتەوەو بێ‌هۆش ، نەخۆش ، هەژار بێت‌و هەست بەهەبوونی زاتی خۆی نەكات‌و نەزانێت .. جەژن .. هیواو خەوون چی‌یەو لە ڕیزی كاروانی پێشكەوتنی ئینسانەتیدا نەبێت !

دووەمیشیان .. كە ـ پیرەمێرد ـ یەكێكی نێوەندیان‌بوو ، خاوەنی بیرێكی نوێی پێشكەوتن‌خووازی بڕوا بەهێزبوو كە خولیای هات‌بووە سەر هەلهاتنی ڕۆژی ژینێكی نوێ‌و ـ وەك‌پیرەمێرد دەڵێت ـ ئاگری نەورۆزیش ڕێ‌گوزەری ئایندەكان ڕوون دەكاتەوە . بێ‌گومان ، ئەمەیش نەك هەر جەماوەری ڕۆشنبیرو دۆستانی ، بەلكو داماوو چەوساوەكانیشی گەرم دەكردەوە ، بۆیەكە بوون بەدۆستیشی ، لەو بەریشەوە بۆیەكە بەربەرەكانی‌كرا .

بەڵام .. ڕقی ئەستووری ئەو ـ دژانە ـ لە پیرەمێردێکی وەك ـ پیرەمێرد ـ هەر لەبەر ئەوەش نەبوو بەتەنها ، بەڵکو لەبەر بیرو هێزی پیرەمێرد بوو کە : ڕۆژنامەو[7] چاپخانەو[8] قوتابخانەی زانستیو[9] لاوانی خوێن گەرمو شمشێری شیعرو پەخشانی پشتیوان بوو کە تەنانەت ـ بۆوێنە ـ لەسەر ڕێگرتن بە یادکردنەوەی نەورۆز ، بە شیعر ، پەلاماری بردووەو گوتوویەتی :

یاخوا ئەو کەسەی ئەم دوو ساڵە
لێم کەوتە گیزە وەك زەردەواڵە
نەی هێشت ئاگری (یارە) بگرێ
چەقۆی ئاهی من جەرگی هەڵدڕێ[10] .

چەقۆی پیرەمێردیش ، قەڵەمبڕەکەی گیرفانی نەبوو .. بەڵکو بیروکردارو قەڵەمبوو کە ڕۆژگارو ڕووداو ، کاریان تێدەکرد .. بە مانایەکی‌تر ، پەیامی نەورۆز پێش‌دەکەوت .. بەڵگەش ئەم 2 « نەورۆزانە » یە :

**یەکەم : نەورۆزانەی بڵاوکراوەی[11] 1943 .**

**نەورۆزانە « گۆرانی »**

مژدەبێ ، ساڵ گەڕایەوە      ئاگری نەورۆز کرایەوە
بەفری زستان تووایەوە      گیا ، وگوڵ ، ودڵ ! ژیایەوە

نوخشەیش بێ لە کوردی هەژار .

گوڵ ، لەباخا ، خۆی دەنوێنێ      بلبل بەڕوویا ئەخوێنێ
هەور ، مرواری دەپرژێنێ      شەماڵ ، ژین‌و ژیان دێنێ
نێرگس مەستەو چاو بە خومار

. . .

وا فەرشی چیمەن ڕاخرا      گوڵاڵە ، بوو ، بە شەوچرا
گوڵ دەستەیان بەست وەك برا      نەسرین‌و لاولاو تێك‌خرا
هاتنە لەنجە سەروو چنار



بلبل شەو بە ئاواتەوە      بادەی شەونم دەخواتەوە
دەگری بە ناڵەو واتەوە      بەڵکو گوڵ دەم بکاتەوە
ئەم پێ‌بکەنێ ، ئەو بگری بە زار

ـ ا .
وەنەوشە ؛ وەك من شین پۆشە      گەردنی کەچ کردووەو خامۆشە
ماتەم دەگرێ‌و بە پەرۆشە      بەهاری لەلا ناخۆشە
بۆ کوردی بێ‌کەسی هەژار

خوازەوی زیندو کردەوە      تەمی لەسەر لابردەوە
کورد بە درشت‌و ووردەوە      دەستیان لای خوا بەرزکردەوە
ڕەنگە خوا ، بیان‌خاتە کار

ئاگری لەسەر گردی یارە      لە تەختگای خواوە دیارە
ئاگری نەورۆزو بەهارە      چرای ڕێی پەروەردگارە
لەگەڵ (نووری طور) بووبەیار

ئاوی ئەو کارێزە جوانە      بێ‌قەوزە ، وڕوون ، وڕەوانە
ئاوێنەی دڵی کوردانە      دەرمان ئەکا لە تەنگانە
کەوتە کار ناڵەی ئیختیار

دووەم : نەورۆزانەی دانراوی[13] 1948

### نەورۆز

ئەم ڕۆژی ساڵی تازەیە نەورۆزە هاتەوە
جەژنێکی کۆنی کوردە بەخۆشی و بە هاتەوە

چەند ساڵ گوڵی هیوای ئێمە پێپەست بوو تاکو پار
هەر خوێنی لاوەکان بوو گوڵی ئاڵی نەوبەهار

ئەو ڕەنگە سوورە بوو کە لە ئاسۆی بڵندی کورد
مژدەی بەیانی بۆ گەلی دوورو نزیک ئەبرد

نەورۆز بوو ئاگرێکی وەهای خستە جەرگەوە
لاوان بە عشق ئەچوون بە بەرەوپیری مەرگەوە

ئەوا ڕۆژهەلات ، لە بەندەنی بەرزی وولاتەوە
خوێنی شەهیدە ، ڕەنگی شەفەق شەوق ئەداتەوە

تا ئێستە رووی نەداوە لە تەئریخی میللەتا
قەڵغانی گوللە ، سنگی کچان بێ لە هەڵەتا

پێی ناوێ بۆ شەهیدی وەتەن شیوەن و گرین
نامرن ، ئەوانە وا لە دڵی میللەتا ئەژین



بەلام هەر ئەم سرووده ئەمرە ، روودا وێکی ترمان دەخاتەوە ، یاد کە چۆن کاری لە نەورۆزو پیرەمێرد کردووە ... ئەوەتە پیرەمێرد ، لەپاش شەهید بوونی 4 ئەفسەرە مێژوویی یەکەی 19 ی حوزەیرانی 1947 بەرایی نایەت ئاهەنگ بگێرێت و لە جیاتی ئەوە ، لەسەر کارتێکی چوارچێوە ڕەش فەتوایەکی ماتەمینی چاپ و بلاو دەکاتەوەو دەڵێت[13] :

« ئاگری نەورۆز ، من هەڵم گیرساندو ساڵان لە گردی مامە یارە بوو ، ئەمساڵ وا لە جەرگمایە ! گوڵاڵە سوورەی نەورۆز گەزیزە ، لە خوێنی ئازیزە . فەتوامدا هەتا تەمی ماتەم نەڕەوێتەوە ، نەورۆز نی یە !! » .

... هەڵەیەکی گەورەش کە دەستەی خێرخوا‌هە ناحەزەکان و کاربەدەستان تێی کەوت بوون ، ئەوەیە ، گوایە ـ پیرەمێردی ڕابەر ـ تاک و تەنهایە . ئەگەر ڕۆژنامەکەی بێ داخرا .. قەڵەمەکەی دەشکێت ! ئەگەر هەوای نەورۆزیشی لێ گیرا .. گیان دەرنابات و دەمرێت ، یان هیچ نەبێت لە ژووری قەلەندەرخانەکەیدا گۆشەگیر دەبێت و کەس بەسەری ناکاتەوە !! بەلام ڕاستیی بەدرۆی خستنەوە .. چونکە دەستەی دووەم هەر پیرەمێرد نەبوو .. بەڵکو هەموو کوردێکی دڵسۆز بوو ، بە زاناو شاعیرو ڕوشنبیرو جەماوەرەوەو هەر یەکە لەمانە ، پیرەمێردێك بوو بۆ خۆی .. هەموویشیان خولیای نەورۆزی نوێ بوون .

بەڵگەی ڕاستیش ـ کە زۆرە ـ مێژوو تۆماری کردووە . بۆ وێنە : مێژوو نووسی ئەمر محەممەد ئەمین زەکی[14] بەگی ـ بەناوبانگ ـ نەك هەر لەسەر نەورۆزو پیرەمێردی کردووەتەوە ، بەڵکو ناحەزانیشی تاوەنبار کردووە .. ئەوەتە بەناوی ـ نەورۆز ـ ەوە ، لە ساڵی 1943 دا گوتارێکی[15] ئاشکرای نووسیوەو دەڵێت :

« بۆ پیرەمێردی خۆشەویست ..

هەموو ئەیزانین کە هەموو ساڵێك زەماوەنگێکی پچووك و یا گەورە ، بۆ ئەم جەژنی طەبیعی یە ئەکەی . هێندێ کەس ، لەم فیکرو عەمەلە باشەی تۆ تێ نەگەیشتن و بوختانی بێ مەعنایان پێ کردی و بۆیەیەکی سیاسی یان لێ داو نەیان هێشت لەسەر ئەم فیکرە بڕۆی . زۆر ناحەق بوون ، چونکە ئەم ڕۆژە ، بەپێی ئەوە کە ئەووەل ڕۆژی بەهارە ، وە مزگێنی ی ژیانەوەی طەبیعەت ئەدا ، بۆ هەموو ئادەمیزاد ، جەژنێکی ڕاستەقینەیەو لایقە کە هەموو کەس تەقدیسی بکاو مەبدەئێکی زۆر باش و طەبیعی ی ساڵی تازەیە . پێشینانی وولاتانی شەرق ، لەم ڕووەوە بە موبارەکیان داناوەو ئەنواعی زەماوەنگ و یاری یان بۆ کردووە ..!! » .

هەروەها عەلائەددین سجادی زانا ، ئەویش لە ساڵی 1944 دا بەناوی ـ جەژنی نەورۆز ـ ەوە هەڵوێستی بەرامبەر

نەورۆزو ناحەزەکانی ، نیشان دەداتەوە ، کە پشتگرتنی پیرەمێردیشە دەنووسێت[16] .

« ڕۆژی نەورۆز جەژنی قەومیی کوردستانە .. ئینجا عەجەبا ڕۆژێك کە بناغەی بووژانەوەی ژیانی قەومێکی تێدا دەرکەوێ ، چۆن ئەو ڕۆژە ئەبێ نەکا بە جەژن ؟ » .

حوزنی موکریانیی[17] مێژوونووسی نەمر ، ئەویش لە ساڵی 1946 دا ، بۆ چەسپاندنی نەورۆز ، دەوری مێژووی کردووەتەوەو دەنووسێتو[18] دەڵێت :

« .. دەستەیێك کوردی جووتبەندەو گوندیی ، چەند دەستە بەرگی زیو بافتو هەڵوای بەخورماو ڕۆنیان بۆ ئیمامی عەلی برد . ئیمام پرسی : ئەمانە چن ؟ ووتیان : دیاریی جەژنی نەورۆزە . ئیمام هەڵواکەی بۆ خۆی خواردو بەرگی بە سێ موسڵماناندا بەشییەوە ـ المحاسن والاضداد ـ لاپەڕە : 237 » . موکریانیی ، بۆ ڕێزی کورد لە نەورۆز ، لێکۆڵینەوەکەی تەواو کردووەو دەڵێت[19] : « لە ئاثاری کورد ، مەموزین ـ ی ئەحمەدی خانی ـمان لە دەستدایە کە سێ سەد ساڵ لەمەوبەر ، کورد بە چ شادمانییەکەوە نەورۆزیان بەجێهێناوەو بەچی دەستوورێك جەژنیان کردووە ! » .

بەم جۆرە .. کاکڵەی ڕاستیی ئەوەیە کە : پیرەمێرد سەرکەوتو خێرخوازەکان پڕووکانو بڵیسەی ئاگری نەورۆزیش ، ساڵ بەساڵ بەرزبووەوە .. ئیتر سەیریش نییە ، ڕۆژی ژیانی پیرەمێردی ـ ئینسان ـ تەواوو ئاوا بووبێتو ئەو بڵێسەیەش ، هەرگیز نەکوژێتەوە کە دیارە ئەزەلییە .

—2—

ڕەنگبێت .. ئەوەی ئەم سەردەمە ، دوو پرسیاری گرنگیان ـ کە ڕەواشن ـ لەسەر زار بێت :

● یەکەم : لێکدانەوەی پیرەمێرد بەرامبەر بە نەورۆز چیبوو ؟ وەڵامی ڕەوانیش لەو ئاوێنەدایە کە ـ گوتاری[20] ـ پیرەمێرد خۆیەتیو بەناوی « نەورۆز » ەوە ، وەڵامی محەممەد ئەمین زەکی بەگی پێداوەتەوە ـ کە دیاریشە وەڵامەکە بۆ هەمووانە ـ و دەڵێت :

« نووری دیدەی منو وولاتەکەم ئەمین زەکی بەگ کە لە گەلاوێژی جاری پێشوودا لە نەورۆزی من دووابوو . دیارە ئێمە بە پەرێزی ئەوا ڕاناگەین ، بەلام گوڵەوەچنیی دریغ نەکراوە ، ئەوا ئەمجارە ، گوڵەوەچنی ئەو پەرێزە ئەکەمو لە نەورۆز ئەدوێم .

نەورۆز ، ڕۆژی نووێ ، ڕۆژی یەکەمی (فرەوەردین) باستانیو نۆی مارتی کۆنی ڕۆمییو 22 ی مارتی فەرەنگ کە ئەم ساڵ ئەکەوێتە شازدەی (ربیع الاول) کە ڕەبیعیش بەکوردی بەهارەو چوار ڕۆژ دووای مەولوودی پێغەمبەرە گەورەکەمانە ، سەری ساڵی تازەی ڕۆژهەلاتییەکانە . ئەو خودایەی کە ئەم دەورو چەرخەی چەرخی داناوە لە (قرآن) دا لە (سورة یونس آیتی پێنجەم ) دا ، فەرموویە (هو الذي جعل الشمس ضياء والقمر نوراً وقدره منازل لتعلموا عدد السنين والحساب ) ئەم حسابەو ژمارەیە زۆر ئەستێرەناس لێکیان داوەتەوەو ئەووەڵ ژمارەکەرو ئەستێرەناس (شیث) کوڕی ئادەمو دووای ئەو (ئدریس) ی پێغەمەر کە جوولەکە بە (ئاختوخ) ی ناو ئەبەن ، ئەڵێن (سپهر) ، ئاسمان دووازدە کەلووی هەیە (برج) هەر کەلوویەکی (30) ڕێبازە ، ئەم ڕۆژە هەر مانگێ ئەپەڕێتە کەلوویەکەوەو هەر ڕۆژە بەڕێبازێکدا ئەڕوا ، بەساڵێك ئەو 12 کەلووەو 365 ڕێبازە ئەبڕێ ، گرەگڕ ئەگەڕێتەوە شارگڕ ئەدا . دیسانەوە ئەکەوێتە گەردو خوڵ ، ئەسووڕێتەوە تا خوا ئەڵێ بەسە . جا هەموو ساڵێك بەپێ ساڵنامەی ئاختوخ ، بەهارەو ئەو ڕۆژەیە کە خوا فەرموویە ( يحي الارض بعد موتها ) گوڵو گیاو درەخت ئەژیێتەوەو زیندەوەرو گیانلەبەر ئەبووژێتەوە ، پێغەمەر کە خواو فریشتەیخوا صەڵەواتیان لە دیداری داوە ، فەرموویە : بای بەهار هەرچۆنێ گیان ئەکاتەوە ، بەر درەختو گەلای سەوزی پێپەیدا ئەکا ، بەو ڕەنگە ڕەنگوبۆیش ئەدا بە ئێوە .

ئەمە چشتێك نییە بشارێتەوە ، هەموو بە چاوی خۆمان ئەیبینینو بەلەشو دەروونی خۆمانا تێدەگەین کە بەهارو نەورۆز ئەو ڕۆژەیە ، زیندەگانی دووبارەی تیایە وە کە ئەچینە دەشتو هەوایەکی بەهارمان لێئەدا هەوایێکی تازەمان ئەکەوێتەوە دڵەوە . کەواتە ئەم لەلەو پڕیە ڕاستەو نەورۆز سەری ساڵە ، خۆڕایی نییە کە کردوویانە بە جەژن .

هەندێك ئەڵێن ، نەورۆز لە زەردەشتەوە داهاتووە ، من وەکو تێگەیشتووم ، گەلێ بەر لەوە (جەمشید) کە چووارەمین

پادشای (پیشدادیانە) و بە حسابی شانامە 2651 ساڵ پێش
زەردەشتە ، ئەم ڕۆژە کەوا نەورۆزی پێ ئەڵێن لە ئاذربایجان لە
شوێنێکی دەشت و چیمەن و گوڵزار ، خێوەتی بۆ هەڵئەدەن و
تەختی زەرنیگاری بۆ دائەنێن ، دەمی بەیان ، زەمزەمەی
مورغ و هەوای شەماڵ خەبەری ئەکاتەوە ، ئەڵێ تەختی بۆ
ئەبەنە دەرەوە ، کەمێ سارد ئەبێ ، ئاگری بۆ ئەکەنەوە ، گڕی
ئاگر و تیشکی ڕۆژ ئەدا لە بەرگی سوورمەو ئەڵماسی تاج و
زەربەختی تەخت لە هەموو لایەکەوە ، ئەڵێن (شید) شید بە
زوبانی پەهلەوی (پرتەوە) خۆی ناوی (جەم) مو ئەو
(پرتوەیش) شیدە ، بووە بە (جەمشید) ئەویش هەستاوە
بەرامبەر بەو ستایشە ، داستانێکی باستانی خوێندووەتەوە ،
ئەو ڕۆژەیان ناو ناوە نەورۆز . دووای ئەوە ، زەردەشت بە
ئیلهام فەرموویە : ئەم ڕۆژە ئەو ڕۆژەیە کە خوا ئەم چەرخ و
ئاسمان و زەمینەی تیا ئافەریدە کردووە .

بێینە سەر ئاگری نەورۆز ، ئەم ئاگرە بە هیچ ڕەنگێ لە
ئاگر پەرستی یەوە نەهاتووەو کاتەکانی زەردەشت
ئاتەش پەرستی تیا نی یە . زەردشت خودای یەکانەی
پەرستووە . ئێستایش لەناو هەموو قەومێکدا ، زۆرتر لە ناو
موسڵمانانەدا لەو شەوانەدا کە بەشەوی پیرۆزی دائەنێن ،
لەسەر منارەو مردو وە شەخسدا قندیل و چرا ئەسووتێنن بەو
نزایە ، خوا پێشیان ڕووناك بکاتەوە . دیارە ئەم ئاگرە بۆ ئەوەیە
خوا ڕێی ساڵی تازەیان ڕووناك بکاتەوە . ئاگریش لە چووار
سروشتی ئادەمیزادا بە باوکی باڵاو موبارەکی ئەژمیری .

پیرەمێرد کە هەموو ساڵێ ئاگری نەورۆز ئەکاتەوە تەنها بۆ
پەیرەوی ی باوو باپیرە . بە بڵێسەی نیاگان ، ڕێ گووزەری
ئایندەکان ڕوون ئەکاتەوە . هەندێ بەوە خۆی چارس کرد ،
پیرەمێردیان بە مەجووسی ئاتەش پەرست دائەنا .. پیرەمێردی
خوێندەوار ئەزانێ ئاگرێك کە خۆی بیکاتەوەو خۆی بتووانێ
بیکوژێنێتەوە ، چۆن ئەیپەرستێ ! پیرەمێرد خوا ئاینێکی پاك و
گووزەرانێکی چاکی داوەتێ ، لەژێر ئەم قوببەی گەردوونەدا ،
هیوای بەکەس نی یەو پەروای لە کەس نیە . سیاسەت بە
سیاسەت ئەزانێ . لا ناکاتەوە .. لە کەس کۆناکاتەوەو پارەیش
کۆ ناکاتەوە .. کورد ناگۆڕێ تا دەچێتە گۆڕێ ! »

● دووەم :پیرەمێرد ، ئاهەنگی جەژنی نەورۆزی چۆن ،
دەگێرا ؟ بیرەوەری ی محەممەد ڕەسوول هاوار ـ ی
نووسەر ، بەجوانی ی وەڵاممان دەداتەوە .. دەڵێت[21] : « ..
هەموو جەژنێکی نەورۆز ، نەورۆزنامەیەکی ئەنووسی یەوەو
بڵاوی ئەکردەوە لە ڕۆژنامەکەیدا ، لە قوتابخانەی زانستی ، یا
لە شوێن گێرانی ئاهەنگەکە ئەخوێنرایەوە .. لەگەڵ ئەوەشدا کە
پیرەمێرد دەستکورت بووەو مانگانەیەکی تەقاعودی ی کەمی
هەبووە ، بەلام پێویستی ی ئاهەنگی نەورۆز ، هەرچی بووایە ،
کەم و زۆر بۆی پەیدا ئەکرد ، خۆی هەموو جارێك ئەیووت :
نانێکەو شەش پاپراخە ... قوتابی یەکانی زانستی ئەبوون
بەپێشەنگ و سەرپەرشتی کەری گێرانی ئاهەنگی نەورۆز .
بەیانی ڕۆژی نەورۆز هەموو خۆیان ئەگۆڕی ، تیپ تیپ بەرەو
گردی مامە یارە ، ئەڕۆیشتن و هەموو بەیەك دەنگ ئەیانووت :

**یادکەن براکە یادکەن**
**یادی کاوەی ئاسنگەر**
**سەر ڕێ و شوێنی بگرن**
**تاکو وەتەن بێتە بەر**

کە بەیانی نەورۆز ئەهات ، زەردو سوور ، ژن و پیاو کوڕو کچ
هەموو ، ڕوویان ئەکردە کاریزی وەستا شەریف ـ کارێزێکە لە
بەردەمی گردی مامە یارەدا ـ لەوێ پیرەمێرد دوو سێ دەواری
پەیدا ئەکرد ، قوتابیانی زانستی و لاوان گرد ئەبوونەوەو ئەبوو
بە گۆرانی و سروود ووتن و هەڵپەڕکێ ، دەهۆڵ و زوڕنای
خۆماڵی ، ئەو دۆڵی کاریزی وەستا شەریفەی ئەهێنایە جۆش و
خرۆش ، لە لایەك هەوهەوەی شۆڕە سوواران ، لە لایەکەوە
جوغزێن و کەوشەك و قەلەمردارەی فەقێ ، لە شوێنێکی ترەوە
سێ بازو ئاشە بەتەنگووریی منالان ، دەرویش عەبدوڵڵای
سەرمابردەڵەش بەخۆی و تەبەقە حەڵواکەیەوە شانی دائەداو
بە شمشاڵەکەی کوروکاڵی ئەهێنایە جۆش و خرۆش ، ئاوازی
خاڵەی ڕێبوار هەمووانی ئەبرد بە ئاسمانێکی خەیاڵاوی زۆر
سەیردا . هەتاکو ئێوارە ئەو قەڵەبالغی یە بە خۆشی و شادی
ڕۆژیان ئەبردە سەر ، جارو بار چیرۆکەکەی ئەژدەهاك و کاوەی
ئاسنگەر بەشێوەی تەمسیل لەو دەشتە لە لایەن قوتابیانی
زانستی یەوە پێشکەش ئەکرا .. کە ئێوارەش دا ئەهات ، زەردو
سوورو ڕەش و سپی ، پۆل پۆل بەرەو ماڵ ئەگەڕانەوە ! » .

... بیرەوەریش کە زۆرەو کەمی کۆکراوەتەوە ، بەو
شایەتی یە تەواو دەکەین کە شاعیری کۆچکردوو أ . ب .

هەوری[٭] لەسەر گەورەترین ئاهەنگی نەورۆزی پیرەمێرد کە لەلای ئێمە ، گوتی :[٭] « .. ئاهەنگی ساڵی 1935 لە هەموویان بەناوبانگترو ناودارتر بوو ، چونکە 4 شەوو 4 ڕۆژ لە کارێزی عەزەجوڵا کە ئێستا لە نزیك خانووە قورەکانی سلیمـانی‌یە ، کرا . ئەم 4 شەوو 4 ڕۆژە ، لەژێر دەوارو چادردا قوتـابیانی قـوتابخـانەی زانستی ، شـەوو ڕۆژ لەوێ دەمانـەوەو پـاش نیـوەڕووان ، گشت دانیشتـووانی شـاری سـولەیمـانی‌و فەرمانبەرانی میری ، دەڕژانـە ناوچـەکە ، بـە بەزمو ڕەزمو هەموو جۆرە یاری‌یـەك‌و شیعر خـوێندنـەوەو هەنـدێ جار ، پەردەی شانۆیی‌یشیان پێشان ئەدا ! » .

... دوواجار .. ئەگەر ئاگری نەورۆزی نوێ بەکردەوەی پیرەمێرد هەڵگیرسابێتەوە .. چی دەبێت ، ئێمەیش ، بەکردەوە پـاداشتی چاکـەی بدەینـەوەو بەشێکی وەسیـەت نامـەکەی بەجێ‌بهێنین کە[٭] دەڵێت :

**« ئامۆژگاریم ئەوەیە .. بەشوێن ماددە مەکەوون .. دنیا بەگران مەگرن . تا ئەتووانن خزمەتی ڕاستو بێ موقابیلی قـەومو زمانو وولاتـەکـەتـان بکـەن‌و دەستی دامـاوان بگرن !؟ » .**

## سەرچاوەو پەراوێز

(1) پیرەمێرد = تـۆفیق مەحمـوود ئاغـای هەمـزاغای مـەسرەف 1867 — 1950 . سلێمانی . / سەرچاوە : پیرەمێـردی نەمـر : نووسـین محەممـەد ڕەسووڵ هاوار . بەغداد : 1970 چاپخانەی . العاني .

(2) سەرچاوەی پێشوو ل : 47 + 48

(3) علاء الدین سجادی : گوتاری « ئـەدیبی بەنـاوبانگی کـورد : پیرەمێـرد » . سەرچاوە : ـ گۆڤاری . گەلاوێژ . ژ 8 . س 4 . آغستوس 1943 .

(4) خان : مەبەست لە دەوڵەتی ئێرانە .

(5) ئەفەندمز : مەبەست لە دەوڵەتی عوسمانی‌یە .

(6) ساحێب : مەبەست لە ئینگلیزی داگیرکەرە . ئەربابەکانیان ئەو ناز‌ناوەیـان دابوویە .

(7) مەبەست لە ڕۆژنامەکان : ـ ( ژیان ـ لە ژمـارە 321 هەتـا 553 کە پیـرەمێرد بەڕێوەبەری بوو ) + ( ژین : تـەواوکەری دووا ژمـارەی ژیان لە 554 ەوە ڕێکەوتی 28 ی کانوونی دووەمی 1939 ) / سەرچاوە : گەلاوێژ ـ آغستوس 1943 .

(8) مەبەست لە چاپخانە : ـ ئەو چـاپخانـەن کە پیـرەمێرد خـەریکیان بـووە . چـاپخـانـەی یەکـەم : چاپخـانەی بلدیـە ـ شارەوانی ـ یـە کە ڕۆژنـامەی « ژیان » ی لە 2 کانوونی‌یەکەمی 1926 ەوە دەرهێنا کە پیرەمێرد لە 1932 دا ـ پاش حسێن ناظم ـ بوو بە بەڕێوەبەری . لە 14 ئابی 1934 دا پیرەمێرد ڕەسمەن چاپخانەکەی لە بلدیە گرت . لە 3 ی ئابی 1937 دا ئیجازەکەی لێوەرگیراوەو بۆیان تازە نەکردەوە . دووەم : ئەو چاپخانە گەورە دەستی‌یەیە کە خۆی بە تیپی تازەوە کڕی‌و لە 20 ی ئەیلوولی 1937 دا ژمارە 539 ی پێ‌دەر کرد هەتا ژمـارە 553 ی 10 ی مارتی 1938 کـە ڕۆژنامـەکە ـ ژیـان ـ داخرا . لە 28 ی کانوونی دووەمی 1939 دا ـ ژین ـ ی دەرکرد کە ئەم ڕۆژنامەیە ، پاش خۆیشی لە لایـەن خزمو دۆستو نـەوەکانی‌یـەوە دەرکرا ( ئێمـە هـەتـا ژ 1714 ی 1963/2/7 مـان دیوە / . ك . ر . م ) ئـەم چاپخـانەیـە کە نـاوبرابـوو بـە چاپخانەی (ژین) لە ماڵەکەی خۆیدا ـ زوورەکەی بـەسەردا ڕووخـا ـ هەر مابوو ، هەتا لە مانگی 11 / 1983 دا ـ بەڕێوەبەری‌یەتی ڕۆشنبیریی جەماوەر لە سلێمانیدا ـ گوواستی‌یەوە بۆ مووزەخانەی ئەتنوگرافی‌ی سلێمانی .
تێبینی : خانووەکەی پیرەمێرد لە جیاتی مووزەخانە بێت ، کۆمـەڵێك خـەڵکی کرێ‌گرتەی تێدایە ؟؟؟. بەدەستکاری‌یەوە لەسەرچاوەی پێشووەوە .

(9) قوتابخانەی زانستی = (قوتابخانەیەکی شەوانەی کۆمەڵە ڕۆشنبیرێك‌بوو بۆ بڵاوکردنەوەی هوشیاری‌و خوێندەواری‌ی لە سلێمانیدا / ك . ر . م) لە 24 ی شوباتی 1926 دا بـە سەرۆکـایەتی ئـەحمەد بـەگی تۆفیق‌بـەگی ـ متصرفی سلیمـانی ـ دامـەزراو هـەتـا 1930 بـەردەوام‌بـوو کـە پـاش ڕاپـەڕینـە نیشتمـانی‌یەکـەی 6 ی ئەیلوولی ئـەو ساڵە تێـك‌چوو .. بـەڵام لە 1932 دا بەسەرۆکایەتی ئەحمەد بەگ ، دیسان دامەزرایەوە ، کـە ئەو گـوێزرایـەوە (پیرەمێرد) بوو بە سەرۆکی . هەتـا پۆلی شـەشەمی سـەرەتایی بـڕی‌کرد . پـڕۆگرامیشی وەك بـەرنامـەی ـ مەعـاریف ـ بوو ، بـاوەڕیشی پێ‌دەکـرا ./ بەدەستکاری‌یەوە لەسەرچاوەی پێشووەوە .
تێبینی 1 : (لە پەنای ئـەم قوتـابخانەیـە گەلێ شـاعیرو خـوێندەوار لە شـاری سولەیمانی‌دا پێ‌گەیشت / مێژووی ئەدەبی کوردی ـ علاء الدین سجادی : ل 434 بەغداد ـ 1952 . چاپخانەی معارف . ) .

2 : ڕۆژنامەی « ژیـان ـ 1936 » کە پیـرەمێرد بـەڕێوەبـەری بووە ، چـەند سروودێکی ـ زانستی‌ی بۆ نەورۆز ـ بڵاو کـردووەتەوە ، بێ‌نـاوبردنی شاعیر . بۆ وێنە ( ژمارە : ـ 470 . س ـ 11 / 7 ئازاری 1936 ) ئەمەی بڵاو کردووەتەوە :

نەشیدی زانستی بۆ نەورۆز

« بولبول‌و فەرزەند »

ئیمڕۆ نەورۆزە وا گوڵ پەیدا بووە
لە عەشقی گوڵدا بولبول شەیدا بووە
بولبول لەسەر گوڵ مانگی بەبانگە
خوێندنی ئێمە ساڵ دووازدە مانگە
ئەو تەنها بۆ گوڵ سەر دەر هەوایە
ئێمە سەربەرزی‌ی قەوممان هیوایە.
بولبول لە عەشقی گوڵدا بەسۆزە

سۆزەی ئیمە بۆ دایکی دڵسۆزە
بولبول دەتۆرێ چون بێوەفایە
ئێمە ڕیشەمان لەم خاکەدایە
بولبول دەڕەنجێ بەجەفای خاشاك
ئێمە بۆ سوجدە سەر دەخەینە خاك
وا دایکی وەطەن هات و دەفەرمووێ
من نەغمەی ڕۆڵەی زانستیم ئەوێ
چونکە زانستی‌ی جێگای هیوایە
میللەت بەزانست لە برەودایە
زیرەکی‌ی ئێمە لەگەڵ زانستی
ئەگەر یەککەون ناکەونە پەستی

(10) سەرچاوەی یەکەم : ل . 49
(11) گەلاوێژ : ژ ـ 3 . س ـ 4 . مارت 1943 .
* تێبینی 1 : وەك خـۆی نووسـراوەتەوە ـ لەبـەر ئەوە کـە گۆرانیی بـووە کە نازانین ئاوازەی چۆن بووە ! ـ
2 : ئەو ڕاستی‌یەش گرنگە کە ئەوەیە ، هەتا ئەم ـ نەورۆزانەیە ـ بەپێی‌کاری ڕۆژگارو کڵپەی بیرو پێشکەوتن ـ چەند دەستکاری‌یەکی تێـدا کراوە . بـۆ وێنە ، بڕووانە : ( نەورۆزنامەی کۆن / گۆڤاری : دەنگی گێتی‌ی‌تازە ـژ ـ 21 . س ـ 3. 25 ی مـارت 1946 ) هـەروەهـا (نـەورۆزنـامـەی نـەسـرین‌و پەروین ـ ی ، بڵاوکراوەی کتێبی « پیرەمێردی‌نەمر » ) .
3 : نەورۆزنامەی نەسرین‌و پەروین لە ( ژیـان : ژ ـ 520 . س ـ 12 / 1937 ) دا بڵاوکراوەتەوە .
(12) سەرچاوەی یەکەم . ل : 119 + 120 .
تێبینی : نووسەری ئـەو سەرچـاوەیە ـ هـاوار ـ دەڵێت : ( لەبیرم دێ ، ڕۆژێك دەمە دەمی عەسر بوو لە شاری سلێمانی ـ وا بزانم ساڵی 1948 بوو ـ لاوان بە کوڕو کچەوە ، بەناو سلێمانیدا بەشەقامەکاندا خۆ پێشـاندانێکی گـەورەیان نـوواند . شـاری سلێمانی بـەتـەواوی سـامی لێنیشت‌بـوو . کۆنەپەرست‌و دوشمنانی گەل بەسەر شۆڕیەوە ئەیان‌ڕوانیە دیمەنی ئەو لاوە خوێن گەرمانە . ئـەو ڕۆژانە ڕۆژەکـانی ڕاپەڕین‌بـوو لە شاری هـەڵەت‌و قوربانیدا ، وەکو هەموو شوێنەکانی تری عراق ... لەو خۆنیشاندانـەدا ، تاقمێك کوڕو کچی منداڵ لەپێش هەموانەوە ، ئەڕۆیشتن . سەرو چەپکە گوڵی ڕەنگاو ڕەنگیان بەدەستەوە بوو . هەموو ڕوویان ئەکردە گردی سەیوان بۆ ئەوەی ئەو چەپکە گوڵانە لەسەر گۆڕی شەهیدانی ڕێی ئازادی‌و کوردستان دابنێن . لەو کاتەدا پیرەمێرد لەبەر دەرگای سەرادا لەبەر دوکانەکەی وەستا حمە سعیدی خەیاتا بە خۆی‌و بۆرە گاڵوکیەوە ڕاوەستـابوو ، چـاوەکانی بڕی‌بووە شەپۆلی ئەو لاوە سەربەرزە نەبەردانەی کە هەموو قین‌و بێزاری‌و تووڕەییان لێ ئەتکا بەرامبەر بە دوشمنانی گەل . پیرەمیرد جاروبـار شانی هەڵئەتەکاندو تفی قووت ئەدا . ڕەنگێکی ئەهێناو ڕەنگێکی ئەبرد ، لە دڵی خۆمدا ووتم : وا دیارە خاڵە شتێکی پێیە . لەو کاتەدا یەکێك کە لە نـزیك پیرەمێردەوە ڕاوەستابوو ، تـوانجێکی زۆر ناڕەواو بێسـەرو پێی گرتـە پیرەمێرد ... لە دووایيدا بیستم کە شەو دایەت‌و میوانەکانی قەلەندەرخانە گـرد ئـەبنـەوە ، پیرەمێـرد ئـەڵێ : جمیـل ، نیـازی لە جمیـل صـائبی خوشکەزایەتی ، کچ‌و لاوەکانی ئەمڕۆت دی ، ئەویش لە وەرامدا ئەڵێ : بەڵێ خاڵە !! پیرەمێرد ( ئەڵێ : دە گوێ بگرە ئەم هەڵبەستەم پێشکەش بەوانـە کردوە . ) ل . 117 + 119 .
(13) سەرچاوەی یەکەم : ل . 50 .
(14) محەممەد ئەمین زەکی بەگ = کوڕی حاجی عبدالرحمنی کوڕی مەحموود . 1880 — 1948 سلێمـانی . / سەرچـاوە : یـادی کـۆچی امـین زکی . 1948 . بەغدا . چاپخانەی معارف . لەسەر ئەرکی علاء الدين سجادی لە چاپ‌دراوە .
(15) گەلاوێژ : ژ ـ1 . س ـ 4 . کانوونی دووەم 1943 .
(16) گەلاوێژ : ژ ـ 4 . س ـ 5 . نیسان 1944 .
(17) حوزنی موکریانی = حسین کوڕی سەیید عەبدوللەتیف کوڕی ئیسماعیل شێخ لەتیفی حوسەینی خەزایی موکریانی . لە 1893 دا لە مەهابـادا هاتـووەتە دنیاوەو لە 20 ی ئەیلولی 1947 دا لە بـەغدادا کـۆچی دوایی کردووە / وەرگێڕدراو لە : (في ذكرى الاديب والمؤرخ : حسين حزني موكرياني ـ حسام الدين النقشبنـدي . « کاروان ـ المسيـرة ـ ژ 14 . تشرینی دووەم 1983 . س . 2 ) .
(18) دەنگی گێتی‌ی تازە : ژ ـ 21 . س ـ 3 / 25 مارت 1946 .
(19) سەرچاوەی پێشوو .
(20) گەلاوێژ : ژ ـ 3 . س ـ 4 / مارت 1943
تێبینی : زۆربـەی ئـەم لێکدانـەوەیـەی ـ پیـرەمێـرد ـ لەوە پێشتـر لە ڕۆژنـامەی : ژیـان ـ 23 مارت 1933 دا بـەناوی « نـەورۆز » ەوە بـڵاوی کردووەتەوە .. لە دووا قسەکانیدا گوتوویەتی :
« ئاخ‌و داخ‌و درێغ ، چەند ساڵە نەورۆزم بە با ئەڕوا یا با نایەڵێ گەردشی چەرخی چەپ گەرد لێم ناگەڕێ . وا ئەم ساڵیش ئیختیاری بێ‌ئیختیار ، لە شارا نەبـوو و جگە لەوەیش تـەمو دووی دوو ماتـەم بەردەرگـای شاری داپۆشی‌بوو . » ؟؟
(21) سەرچاوەی یەکەم :ل . 46 + 47 .
(22) ا . ب . هەوری = ئەبووبەکر جەلال ئاغا : 1915 ـ 1979 سلێمانی .
(23) وەرگیراو بەتـەلەفوون‌و تـۆمارکـراو لەسەر شریت لە لایەن ـ ئێمـەوە ـ ئێـوارەی 2 شەممـە 26 /2/ 1979 بۆ بـەرنامـەی ڕادیۆیی (ڕۆژێ لە ڕۆژان « سەعاتێکی تایبەت بۆ نەورۆز » / ك . ر . م ) بڵاوکراوەی سەعات 9 ی شـەوی شەممـە 1 — 1979/4/2 + دووبارە : سـەعات 1 ی ڕۆژی هـەینی‌ی 1979 / 4 / 6 .
(24) سەرچاوەی یەکەم : ل . 20 + 21 .
وێنەکان :
کۆکراوەمانە . لەمەڕ وێنەی پیرەمێرد لە نـەورۆزدا چەنـد کەسێکی دنیـادیدە گوتیان کە گوایە وێنەی 1946 . وێنەی دووەمیش گوایە لایەکی نەورۆزی 1952 ە .

# نەورۆزو بەهار لە فۆلکلۆری کوردیدا

• دوکتۆرە شوکریە رەسوڵ •

هەر لە مێژەوە نەورۆز لای کورد وەك رەمزێك ئاشنایی و پەیوەندی بە گەل و خاکی کوردستانەوە بووە .. لەگەل سەرهەڵدانی نەورۆزو بەهاردا مژدەی سەر لەنوێی بوژانەوەی گوڵ و گیاو دارو درەخت و قەڵبەزەی سوڵاف و کانی چەم و کووخی جووتیاران و باڵندەی ئەو وەرزە بووە ..

ئەم سروشتە جوانە وەك پەیوەندییەکی دیالێکتیکی نێوان جوانی ناو ژیان و جوانی هونەری ژیان لە ئەدەبی فۆلکلۆری و ئەدەبی نووسراودا رەنگی داوەتەوە . نەورۆزو بەهار لە ئەدەبی فۆلکلۆریدا بە تایبەتی گۆرانی لاوك و حەیران ، پەندی پێشینان و قسەی نەستەق و لاوانەوە شوێنێکی تایبەتی گرتووە .. سروشتی رەنگاورەنگی کوردستان ئەوەی بۆ خۆی خەملاندووە کە رۆژێك لە وەرزی بەهار بکاتە جەژنێکی دوو بەهارە کە جەژنی نەورۆزی بەهارو جەژنی گەلی کوردە . لە فۆلکلۆری کوردیدا وەك ئەدەبێکی خولقێنەری سەرزاری گەلی وەرزی بەهار پەیوەندییەکی گیانی بە گیانی لەگەل مرۆڤ و سروشتدا هەیە ، کورد وەرزی بەهاری لە ئاوی سازگارو دەشت و چیاو دۆڵەکان و گوڵاڵە سوورەی بەهار تێکەڵ بە گۆرانی ئەکات ، کە نموونەی خۆشەویستی ی خاك و سروشتی جوانی وڵاتی لە هەستی نیشتمان و گەلەکەیەوە سەری هەڵداوەو لە ژیانی ریالیستیدا دەرکەوتووە .. گۆرانی ی کوردی بە گشتی و گۆرانی ی وەرزی بەهار بە تایبەتی ئاوێنەی سۆزو ئاوازو هەستی دەروونی کوردە کە بێ پێچ و پەناو شەرم نەکردن راستەوخۆ مەبەستی دڵی خۆی درکاندووەو نموونەی راستگۆیی و دڵسۆزی و پاکی لە لاوك و حەیران و بەشەکانی تردا نەخشاندووە .

ئەگەر بە ووردی لە لاوك و حەیرانی کوردی بکۆڵینەوە دەبینین زوربەی زۆری لە وەرزی بەهاردا سەری هەڵداوە ، لاوکی کوردی ئەم وەرزە زوربەی زۆریان لە رووداوێکی قارەمانی و تراژیدیای کورد لە پێناوی وەدەست هێنانی ماف خودموختاری ، یاخود نەگەیشتنی دوو دڵدارمان بۆ دەنەخشێنێ ، وەك لە لاوکی « نوری باوێل ئاغاو سمایل بەگی رەواندز »[1] دا دەر ئەکەوێ ... لە وەرزی بەهاردا ناکۆکی ئەکەوێتە بەینی ئەو دوو بنەماڵە ناودارەی رەواندوزو پاش کوشتارێکی زۆر کەسیان نامێنێ و کارەساتەکە بە شێوەیەکی

